

# چیرۆکی ئەستێرەکان

وەرگێڕانی : ناز فەلەکەدین کاکەیی

PDF 4 KURD

بەردەست لە دەستی بەڵێنی نامرۆڤانەی ئاغا تووڕە بوو، بەڵام نەیدەتوانی بچووکترین گلەیی بکات. ناچار بزنی برد و چوو بۆ نێو دەشتایی و سەوزایی، ئەوجا بەردەست بزنی بەرەڵا کرد و گوتی: «بڕۆ تۆ ڕزگاری، هەموو ئەم ماوەیە دەبوایە تۆ ئازاد بکرایەی تا منیش لەم هەموو ئازارە ڕزگارم ببوایە».

بەردەست بە دەستی بەتاڵ بۆ کۆشکی ئاغا گەڕایەوە.

ئاغا بە پەشۆکاوی پرسیاری لێ کرد ، کوا گوێدرێژ و پێستی بزن لە کوێیە؟ ئایا لە بیرت چوو کەوا بۆ ئازادیت دەبێت مەشکە ساز کەی، دۆ دروست کەی و ڕۆنی لێ بگری و بزنێکی سپیی تر بکڕی.

بەردەست ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی :«بزنەسپییەکەی تۆ زۆرتر لە من شایەنی ئازادی بوو، هەر لەبەرئەوەش ئەو بەدبەختەم لەم هەموو گیروگرفتە ئازاد کرد. خۆمیش چیتر باسی ئازادی ناکەم».







PDF 4 KURD

# پشیلەی پۆتین لە پێ

لە دێر زەمان ئاشەوانێک لەگەل سێ کوڕی بەیەکەوە دەژیان. لەسەر داری دنیا ئاشێک و گوێدرێژک و پشیلەیەکیان هەبوو. ئاشەوان پێش مردنی. ئاشەکەی بە کوڕە گەورەکەی دا و گوێدرێژی بە کوڕە ناوەنجییەکەی دا و تەنیا پشیلەیەک بۆ کوڕە بچکۆلانەکە مایەوە! ئەم پشیلەیە جوانە بە خاوەنە گەنجەکەی گوت: «نیگەران مەبە، سەبرکە تۆ لە هەردووک برای خۆت باشتر دەبی. ئێستا جووتەک پۆتینم دەوێت و ماوەیەک لە ماڵ دەردەچم.»

بەیانی بوو کە پشیلەی پۆتین لە پێ بە ڕێ کەوت. لە ڕێگا کەروێشکێکی بە تەڵە گرت، کەروێشکەکەی بۆ کۆشکی پاشا برد و بە پاشای گوت: خاوەنی من (مارکۆس کاراباس) ئەم کەروێشکەی پێشکەشی جەنابت کردووە.

پاشا خۆشحاڵ بوو. پشیلە دووبارە گەڕایەوە و دوو کەوی جوانی بە پاشا دا. پشیلە دوای ماوەیەک ئاگاداری ئەوە بوو کە پاشا و کچی لە دەم ڕووبارێک تێپەڕ دەبن، لەبەرئەوە بە خاوەنەکەی گوت: کراسەکەی دەرکات و خۆی بە ئاوەکە دابدات.

خاوەنەکەی گوتی:« بەڵام من مەلەوانی نازانم !»

پشیلەکە گوتی: «باشتر، زوو وەرە ! ئەوە پاشا نزیک دەبێتەوە.»

کوڕە گەنجەکە خۆی خستە ڕووبارەکە و کاتێک پاشا نزیک بووەوە، پشیلەکە بە دەنگی بەرز هاواری کرد، هاوار ... هاوار... خاوەنی من مارکۆس کاراباس ئاو بردی. وا دەخنکێت!

پاشا فەرمانی بە پاسەوانەکانی دا کە مارکۆس کاراباس ڕزگار بکەن.

پاشان کە مارکۆس کاراباس ڕزگاری بوو، پاشا جل و بەرگێکی جوانی پێ بەخشی تا لەبەری بکات.

مارکۆس کاراباس لە نێو ئەم کراسە تازەیەدا ئەوەندە کەڵەگەت و جوان ببوو، کە کچی پاشا چاوی پێی کەوت لە تەماشاکردنی تێر نەدەبوو. پاشا بە مارکۆس







PDF 4 KURD

کاراباسی گوت: «تۆ دەبێت لەگەڵ ئێمە لە ناو گالیسکە دانیشی ، تا سوپاسی دیارییەکانت بکەم.»

پشیلەی پۆتین لە پێ دیسان بە ڕێ کەوت. لە ڕێگا بە دوو جووتیار گەیشت و گوتی :«ئەگەر ئێوە نەڵێن ئەم زەوی و زارانە زەوی و ماڵی (مارکۆس کاراباس )ە دەکوژرێن !

جووتیارەکان بە یەکتریان گوت: «فەرمانی ئەو جێبەجێ ناکەین.»

پشیلەی پۆتین لە پێ بە قەڵاتی دێوێک گەیشت کە خاوەنی زەوییەکان بوو.

پشیلە دەستی بە قسەی خۆش کرد لەگەڵ دێوەکەدا، دوای ئەمە داوای لە دێو کرد کە خۆی بکات بە شێر.

دێوەکە بوو بە شێرێکی تووڕە.

پشیلەکە دیسان داوای لێ کرد تاکو خۆی بکات بە مشک. دێویش خۆی وەکو مشکێک لێکرد. لە پڕێکدا پشیلەکە بە پەنجەکانی مشکەکەی گرت و خواردی. پاشان پشیلەکە چووە کۆشکی پاشا و گوتی: خاوەنی ئەم هەموو زەوی و زارانە (مارکۆس کاراباس)ە.

پاشا لەبەر زیرەکیی مارکۆس کاراباس. کردی بە جێگری خۆی و پیرۆزبایی لێ کرد.

هەموو چوونە ناو قەڵاتەوە و ئاهەنگێکیان لە ناو قەڵا دەست پێ کرد و پاشا دەستی کچەکەی خۆی بە نیشانی دەستگیرانی لە ناو دەستی مارکۆس کاراباس دانا. مارکۆس کاراباس بە شادی و دڵخۆشی دەستی کچی پاشای گرت. کاتێک هەردوو چوونە ناو قەفەسی زێڕین پشیلەی پۆتین لە پێ بوو بە گوڵێکی جوان و خنجیلانە لە ناو ماڵ و کۆشکی بووک و زاوای تازە.



PDF 4 KURD



# بزنی ئازاد کراو

ئاغایەک و بەردەستەکەی لە گوندێک ژیانیان بەسەر دەبرد. ئاغا بزنێکی سپیی هەبوو. ڕۆژێک ئاغا بە بەردەستی خۆی گوت: «ئەگەر تۆ ئەم بزنە بۆ دەشتایی بەری تا باش بلەوەڕێت و قەڵەوی بکەیت، ئەوە منیش تۆ ئازاد دەکەم.»

بەردەست بە هیوای ئازادی، بزنی بۆ دەشتایی برد. چەند ڕۆژێک سەوزە گیای تازەی پێ دا.

دوای ماوەیەک بزنەکە قەڵەو بوو. بەردەست بزنەکەی بۆ لای ئاغاکەی بردەوە و گوتی: «ئاغا، ئەمەیش بزنی قەڵەوە کە داوات کرد بوو! ئاخۆ ئێستا ئازادم دەکەی ؟»

ئاغا دەستی بە پشتی بزنەکە داهێنا و گوتی: «وای چ بزنێکی قەڵەو و گۆشتنە، ئافەرین بۆ تۆ ئەی بەردەستی ژیر و زیرەک: ئێستا بڕۆ مووی بزنەکە بە بەجۆ بڕنەوە و بۆم بێنەوە ئەوجا ئازادت دەکەم.»



بەردەست بە پەلە مووەکانی بزنی لێ کردەوە و بۆ ئاغای هێناوە و گوتی :«ئاغا، ئەمەیش مووەکانی بزنەکە، ئێستا مۆڵەتی ئازادیم پێ دەدەیت.»

ئاغا دەستی بە پێکەنین کرد و گوتی: «ڕاوەستە بڕۆ شیری بزنەکە بدۆشە و بۆم بێنە تا بتوانم ئازادت کەم .»

بەردەست هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و بزنی برد و دۆشی و شیرەکەی بۆ ئاغا هێنایەوە. ئاغا شیرەکەی وەرگرت و گوتی: «پێش ئەوە کە ئازاد ببیت، دەبێت ئەو بزنە ببەیت بۆ لای گۆشت فرۆش تا سەری ببڕێت، دوای ئەمە بە پارەی ئەو گوێدرێژێک بکڕی، دوایی پێستی بزنەکەم لەگەڵ گوێدرێژ بۆم بهێنی، دواتر لە پێستی بزنەکە مەشکێک دروست بکەی و، پاشان شیرەکەی بکەی بە ماست ، دوای ماست بیکەی بە دۆ و، دۆیەکە بکەی بە ڕۆن و، ڕۆنەکە لە بازاڕ بفرۆشی و بە پارەی ئەو ڕۆنە بزنەکی سپیی تر بکڕی و، بۆم بێنی. منیش ئەو کاتە بەڵێن دەدم و ئازادت بکەم.



PDF 4 KURD

# چیرۆکی ئەستێرەکان

نازانم کەی بوو کە هەستم کرد دایک و باوکم نییە، یەکەم جار وامدەزانی کە هەموو کەس وەکو من دایک و باوکیان، پوور و پلک و یان خاڵ و مامیان نییە، بەڵام دواتر کە هەستی ناسکم وای لێ کردم کە لە خۆم پرسیار بکەم، ئەی کوا خوشک و برا و دایکی من.

بە بیرم دێت کاتێک لە ماڵی خاڵم بووم، لەگەڵ کچە خاڵەکانم یاریم دەکرد، بە تەنیا لە ژێر پلیکانەی ماڵەوە بووکەشووشەکانم دەبرد و خۆمیش لە ناو کارتۆنێکی گەورە دادەنیشتم و هەستم دەکرد ئەوە خانووی منە و بووکەشووشەکان خوشک و برا و دایک و باوکمن.

کاتێک خاڵم لە کارکردن دەگەڕایەوە ماڵەوە منداڵەکانی خۆیان فڕێ دەدا باوەشی باوکیان، منیش کە لە پاشەوە دەمامەوە، زۆر بێ دەنگ دەبووم و بە هێمنی بۆ لای خاڵۆم دەچووم. کاتێک باوەشی دەکردەوە تا ماچم کات، بەڵام هیچ هەستم بەوە نەدەکرد دەبێت باوکم بێت، هەرچەندە خاڵۆم زۆر بە سۆز بوو.

تەنیایی و دووره پەرێزی لە منداڵان، وای لێ کردبووم کە لەگەڵ بووکەشووشەکانم چەند ساتێک قسە بکەم، تا ماندوو دەبووم و دەخەوتم.

دوای ماوەیەک لە ماڵی خاڵۆم چوومە ماڵی باپیرەی خۆشەویستم.

باپیرە پیاوێکی باش و دڵۆڤان بوو، هەرگیز لە بیری ناکەم، تەنانەت دەستە





نەرمەکانی کە هەموو جار لەگەڵ پرچە لوولەکەم یاریی دەکرد و بەزەیی باوکانەی هەبوو.

هەموو ڕۆژێک کە ئێوارە دادەهات گیرفانی خۆی پڕ لە شەکرۆکە و شیرینی دەکردم و بۆی دەهێنام، منیش بەتاو خۆم بۆ باوەشی فڕێ دەدا . بە ڕاستی باوەشی بۆنی باوەشی بابەی لێ دەهات. ئەویش سەرمی بە سەر سنگی خۆیەوە دەنا و، هەناسەیەکی ساردی بۆ هەڵدەکێشا .

لە باپیرەمەوە بە ڕاستی زانیم کە کێم؟ دایک و باوکم لە کوێن؟ لەبەرئەوە گیروگرفتی دەروونیم زۆرتر بوو، هەموو جار بە تەنیا دادەنیشتم و بە قووڵی بیری ئەوەم دەکرد کە خۆزگە لە گەڵ دایک و باوکم دەبووم. جاری وا هەبوو حەزم لە بێ دەنگی بوو، تەنانەت دەنگی باڵی باڵندەیەک منی ئازار دەدا .

شەوێک کە باپیرە وەکو هەموو جار دەموچاوێکی پاک و ڕووناکی هەبوو، وردە وردە بۆ سەربانی خانوو دەچوو تا هەندێک ڕاکشێت، منیش بەدوایدا چووم و خۆم لە تەنیشتی درێژ کرد .

گوتم: باپیرە گیان من هەموو شەوێک تەماشای ئەستێرەکان دەکەم، بەڵام ئەم دوو ئەستێرەیە لە هەموو ئەستێرەیەک ڕووناکترن.

باپیرە گوتی: ئەم ئەستێرانە دایک و باوکی تۆن و، چاوەڕوانی تۆ دەکەن. ئەم ئەستێرانە لە وڵاتێکی دوور دەژین، کە هی خۆیان و باب و باپیرانیان نییە، بەڵام ئەوان بۆ ئازادکردنی خاکی باپیرانیان دژی دوژمنان ڕاوەستاون.

دایک و باوکی تۆ زۆر باش و دڵۆڤانن. تۆ تاکە ڕاسپاردەی ئەوانی لای من. دەبێت باش چاوم لێت بێت و ئاگاداریت بکەم تا ڕۆژێک لە نێوان ئەم دوو ئەستێرەیە بڕازێنیەوە.

پاشان کە تەماشای چاوەکانی باپیرەم کرد، لەبەر ڕووناکی مانگدا کە بە ڕوومەتی دەکەوت، نەرمە فرمێسکی جوان و زەڵاڵ دەهاتنە خوارەوە.

بەیانی بوو کە لە خەو هەڵستام باپیرە ڕۆیشتبوو..

ئەو ڕۆژە باپیرە نەگەڕایەوە، دوایی کە زانیم ئۆتۆمبیل لە قاچی باپیرەی دایە و سەقەتی کردووە.

من لە قووڵایی دڵمەوە دەستم بە گریان کرد و ئەم بەسەرهاتەی باپیرەم وای لێ کردم دیسان بە تەنیا بمێنمەوە.

دوای ماوەیەک باپیرە کۆچی دوایی کرد و بەجێی هێشتین.

بەڵێ، باپیرە چوو، ئیتر کەس نەبوو لە کۆشیدا بحەسێمەوە و چیرۆکی دایە و بابەم بۆ بڵێتەوە. بەڵێ باپیرە چوو...

تەنانەت ڕۆژانی پێنج شەممە کە بۆ سەر گۆڕی باپیرە دەچووم و بێ دەنگ پەنام بۆ لایەک دەبرد و تەماشای خاکی سەر گۆڕی باپیرەم دەکرد. لە ناخی دڵمەوە بە بێ دەنگی دەگریام و لە دڵمەوە دەمگوت: باپیرە گیان هەموو شەو ئەستێرەکان لەگەڵم دەدوێن و دڵم دەدەنەوە تا خەمی دووری تۆم نەبێت.

ماوەیەکی زۆری پێ چوو، خەم و خەفەت هەموو ڕۆژێک میوانی من بوو و لە







PDF 4 KURD

دەرگای دڵی منیان دەدا . گشت دنیا لە پێش چاوم پڕ بوو لە تەم و مژ، تەنانەت ئاواز و خوێندنی کوکوختی و باڵندە جوانەکانی شارەکە نەغمەی ناخۆشی دڵتەنگییان دەدا . لەدوای باپیرە ئازیزەکەم، پوورەم بوو بە سەرپەرشتییاری من، ئەو هەموو جار جلوبەرگی قوتابخانە و جانتا و قەڵەم و دەفتەری مەکتەبی بۆم ئامادە دەکرد و چاودێریی منی دەکرد .

ڕۆژان هاتن و چوون، تا دوژمنان لە وڵات دەرکران و باسی ئازادی دەکرا . من نەمدەزانی واتای ئازادی چییە! باسی دیموکراتی دەهات، زۆر سەیر بوو بۆم! باسی ئەوە هات کە دایک و باوکم دەبینم زۆر خۆشحاڵ بووم کە ئیتر بە تەنیا لە گۆشەیەکی کز دانانیشم. منیش وەک منداڵانی تر دایک و باوکم هەبوو، ئیتر حەزم لە دەنگی باڵندەکان بوو، پێم لەسەر زەوی نەدەڕۆیی ، پێم خۆش بوو بفڕم و وەک باڵندە و مەلەکان، باڵم هەبوایە.

بەڵێ ، بەو ڕۆژە گەیشتم... من دایە و دوای ئەوەش بابەم دیت ، گەرمایەکی زۆر هەموو لەشمی داگرت، ئایا تام لێ بوو؟ یا گەرمای خۆشەویستی بوو! نازانم، وامدەزانی هەمووی خەون و خەیاڵە.

ئێستا چەند ساڵ لە تەنیایی و بێ کەسیم بەسەر چووە، شەوان کە تەماشای ئاسمان دەکەم لە نێوان دوو ئەستێرەی ڕووناکەوە ئەستێرەیەکی بچووک و وردیلە دەبریسکێتەوە، بەڵێ ئێستا منیش لەگەڵ ئەستێرەکان دەژیم، ئەو ئەستێرانەی کە بۆ ڕزگاری لە دەست هەژاری و دیلیەتی بۆ خاک و خەڵکی وڵاتیان بەهەموو هێزێک







PDF 4 KURD

## نەهەنگی گەورە و ماسی و دەریاوانی زیرەک

لە دێر زەمانەوە، لەناو دەریایەکی مەزن نەهەنگێک ژیانی بەسەر دەبرد.

خواردنی ئەو نەهەنگە گەورەیە گیاندارانی ناو ئاوی دەریا وەکو، قرژاڵ، گوێچکە ماسی، بۆق ... و چەندان جۆر ماسییکە بوو.

ئەو نەهەنگە لەبەرئەوەی کە زۆر نەوسن و چڵێس بوو گیاندارەکانی ناو دەریای هەموو خوارد، ڕۆژێک کە گەیشتە نێو دەریایەکی گەورە ، هیچ گیاندارێک نەما بێجگە لە ماسییەکی بچکۆلانە. نەهەنگی گەورە هیچ کاتێک ماسی بچکۆلانەی نەدیتبوو. دەزانن بۆچی؟ لەبەر ئەوەی کە ماسی بچکۆلانە لە تەنیشت گوێچکەی نەهەنگ مەلەی دەکرد. ئیتر کە ماسیی بچکۆلانە تا ئەو ڕۆژە لە مەترسی ڕزگاری ببوو. نەهەنگیش چەند ڕۆژێک برسی و ماندوو ببوو. هەموو جێگای دەریای سەر و بن کردبوو، بەڵام هیچ شتێکی بە دەست نەهێنابوو تا بیخوات. لە ناکاو دەستی بەهاوار کرد (من برسیمە، برسی) لەم دەریا گەورەیە هیچ خواردنێک بە دەست ناکەوێت. ئەوجا ماسی بچکۆلانەکە وەکو هەموو جارێک لە تەنیشت گوێچکەی نەهەنگ مەلەی دەکرد، دەنگی بەرز کرد و گوتی: «بۆچی هاوار دەکەیت، یەک شت ماوە». نەهەنگی گەورە بێ ئەوەی کە پرس بکات تۆ ناوت چییە و کێیت، وەڵامی دایەوە و گوتی چی ماوە ؟

ماسی گوتی: «مرۆڤ، تۆ تا ئێستا گۆشتی مرۆڤت تام نەکردووە.»

نەهەنگ وەڵامی دایەوە : «نە،... مرۆڤ چ جۆرە گیاندارێکە؟ تامی چۆنە؟»

ماسی بچکۆلانە گوتی: «گیاندارێکی گەورەیە و زۆر خۆشە.»

نەهەنگەکە بە دڵخۆشییەوە وەڵامی دایەوە و گوتی: «باشە مرۆڤ لە کوێیە، جێگاکەی بە من پێشان بدە.»

ماسی گوتی: «بۆ گەیشتن بە مرۆڤ دەبێت سەد جار بە قەد بەژنی خۆت بە لای



پێشەوە مەلە بکەی و پاشان دە جار زۆرتر لە باڵای خۆت بە لای ڕاستەوە بڕۆی ، ئەوجا مرۆڤ پەیدا دەکەی، مرۆڤ لەوێ لە نێو بەلەمێکی بچکۆلانە دایە و لە ناوەندی دەریا دانیشتووە. بێجگە لە جووتە پێلاوێکی وەرزشی و کراسێک و پانتۆڵێک و چەقۆیەکی گەورە و گوریسێک هیچ شتێکی تری پێ نییە. ئەو دەریاوانی کەشتییەکی شکاوە.»

نەهەنگ لە خۆشییا سێ جار لەسەر کلک هەستاوە و سووڕا، دوای ئەمە ئامادەی ڕۆیشتن بوو.

ماسی بچکۆلانە گوتی: «بەڵام گوریسەکە لە بیر نەکەی.»

نەهەنگ مەلەی کرد و سەد جار زۆرتر لە بەژنی خۆی بۆ پێشەوە چوو، دوایی دە جاریش زۆرتر لە باڵای خۆی بەلای ڕاستەوە سووڕا ، ئەوجا کاتێ لەناو ئاو مەلەی دەکرد دەریاوانی دیت کە لە نێو بەلەمێکی بچووک لە ناوەندی دەریا دەگەڕا. هیچ شتێکی پێ نەبوو، بێجگە لە جووتە پێلاوێکی وەرزشی و کراسێک و یەک پانتۆڵ و چەقۆیەک و گوریسێک.

ماسی بچکۆلانەکە هاواری کرد: نابێت گوریسەکە لە بیر بکەی.

نەهەنگ کە زگی قوڕە قوڕی پێ کەوتبوو، بۆ پێشەوە چوو و نزیک بووەوە و دەمی زۆر کردەوە. دوای ئەمە بەلەم و دەریاوانەکە و جووتە پێلاوەکە و چەقۆ و گوریسەکەی قووت دا.

دەریاوان هەتا هات خۆی زیرەک کات لە نێو زگی نەهەنگ چاوی کردەوە. زگی نەهەنگ جێگایەکی گەرم و نەرم بوو. بەڵام دەریاوان حەزی لە ناو زگی نەهەنگەکە نەبوو، لەبەرئەوە دەستی بە هاوار کرد، هەڵپەڕی و ئاهـ و ناڵەی کرد و دەستی بە گریان کرد.

نەهەنگیش لەو هەموو جموجۆڵەی دەریاوان تووڕە بوو و زگی بە ئێش هات و، هاواری کرد و گوتی: «ئەمە ئیتر چ جۆرە گیاندارێکە.» ماسییە بچکۆلانەکە کە لە تەنیشت گوێچکەی نەهەنگ مەلەی دەکرد گوتی: «وای من لە بیرم چوو پێت بڵێم مرۆڤ زۆر زیرەکە.»

نەهەنگ گوتی: «باشە، چۆن لە دەستی ڕزگار بم.»









ماسییە بچکۆڵانە گوتی: «زارت بکەرەوە و پێی بڵێ لە زگت دەرچێت.»

نەهەنگ زاری کردەوە و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: زووکە ... خێراکە وەرە دەرەوە. دەریاوان خۆی بە قورگی نەهەنگ گەیاند؛ سەیری دەرەوەی کرد و دوایی گوتی: «نە ... لێرە نایێمە دەرەوە، نە،... دەبێت من ببەی بۆ وشکایی.»

نەهەنگ ناچار بوو بەرەو لای وشکایی مەلەی کرد. دەمی کردبووەوە و هاواری دەکرد.

دەریاوانەکە بە ڕاستی زیرەک و ژیر بوو، بە چەقۆ بەلەمە بچکۆڵانەکەی پارچە پارچە کرد. پارچە دارەکانی لە تەک یەکتری دانا و، دوای ئەمە بە گوریسەکەی خۆی توند و ڕێکوپێک بەیەکەوەی گرێ دان.

بەم جۆرە، تۆڕێکی لە دار دروست کرد، تۆڕە دارەکەی لەبن زگی نەهەنگ دانا و گوریسی بە دەست گرت و چاوەڕوان بوو تا نەهەنگ بۆ لای وشکایی بڕوات، لە کۆتاییدا نەهەنگ بە وشکایی گەیشت و هاواری کرد «ئەمەش وشکایی، بڕۆ و خۆت گوم کە.» دەریاوان لە کاتێکا کە سەری گوریسی لە دەست بوو لە نێو دەمی نەهەنگ بازی دا پاشان، گوریسەکەی بۆ پێشەوە کێشا. ئەوجا تۆڕە دارەکە لە گەرووی نەهەنگەکە ئاسێ بوو.

دەریاوان بۆ سەر وشکایی بازی دا و گوتی: «باشە، ئەی نەهەنگی گەورە، بەم تۆڕە دارەی کە لە قورگت ئاسی بووە، چی تر ناتوانی شتی گەورە قووت بدەی.»

دەریاوان ئەوەی گوت و لەسەر وشکاییدا دەستی بە ڕاکردن کرد. ئەو دەیویست زوو بۆ ماڵەوە بڕوات و داوا لە دایکی بکات تا گوریسێکی تری بۆ ئامادە بکات.

ئێستا با بزانین نەهەنگی گەورە چی بەسەرهات، بەڵێ، لەو ڕۆژەوە تۆڕی دارینی لە قورگی نەهەنگ گیر کردبوو. خواردنی زۆر شتی لەو بڕیەوە، ئەویش ئیتر لە نەوسنی و زۆر خواردن دەستی هەڵگرت و بە کەم خواردن خۆی ڕاهێنا، ئینجا لەبەرئەوەیە کە نەهەنگەکان هیچ کاتێک مرۆڤ ناخۆن.



PDF 4 KURD

# کەروێشکی میهرەبان

سمۆرە و ڕێوی و قالەڕەشکە و کەروێشک هاوڕێی یەکتر بوون، بەیەکەوە لە جەنگەڵێکی گەورەدا دەژیان. ڕۆژێک لە ڕۆژانی ساردی زستان سمۆرە بچکۆڵەکە برسی بوو، لە ماڵەکەی خۆیدا لە پێش ئاگرێکی گەرم دانیشتبوو، چاوی لە بارانی بە خوڕ بڕیبوو. لە جێگای خۆی هەڵستاوە. جلی گەرمی لەبەر کرد و شاڵی لەسەر مل دانا و بۆ بە دەستهێنانی خواردن چووە ناو جەنگەڵێکی گەورە.

دەرەوە زۆر سارد بوو و سمۆرە بچکۆلانەکە کون بە کون بە دوای خواردندا دەگەڕا. لە بن بەردێکدا پیرە مام ڕێوی لە ناو کولانەکەی دانیشتبوو و برسی بوو، نەیدەزانی بۆ بەدەستهێنانی خواردن چی بکات، پاشان لەبەر برسێتی تاقەتی نەما و، لەژێر لێفە گەرمەکەی دەرچوو تا بڕوات خواردن بۆ خۆی پەیدا بکات.

لەسەر دارگوێزێک کە بەفر داپۆشیبوو قالەڕەشکە هێلانەیەی هەبوو و کڵاوێکی لەسەر نا بوو، لەبەرئەوەی کە پەسیووی گرتبوو بۆیە بە چەند چیلکە دارێک ئاگرێکی گەشی کردبووەوە و بە دەست و باڵی خۆی گەرم دەکردەوە و بە دەنگی بەرز دەیگوت: (قاڕ... قاڕ...) برسیمە با بفڕم، بەڵکو خواردن بدۆزمەوە! مام ڕێوی وەڵامی دایەوە منیش برسیمە و نەمتوانیوە هیچ بەدەست بێنم.

دەنگی قالەڕەشکە دەهات کە دەیگوت: قاڕ... قاڕ... برسیمە هاوڕێیان، چیتان هەیە بخۆم؟





ڕێوی و سمۆرە گوتیان ئێمەش برسیمانە!

هەرسێ هاوڕێ پێکەوە بیریان دەکردەوە، کە چۆن و بە چ ڕێگایەک خواردن بە دەست بێنن.

سمۆرە گوتی: گەلی هاوڕێیان وەرن، با بڕۆین بۆ لای کەروێشک، بەڵکو ئەو بتوانێت هەندێک یارمەتیمان بدات.

هەر سێ هاوڕێ بەرەو ماڵی کەروێشک بەڕێ کەوتن.

تەق...تەق...تەق... لە دەرگای ماڵی کەروێشکیان دا و دووکەڵی ڕەش لە کونی لوولەی ئاگردانی خانووی کەروێشک دەهاتە دەرێ، پێ دەچوو ماڵێکی گەرم و نەرم بێت.

کەروێشک کە دەرگای کردەوە بە ڕوویەکی خۆش بە خێرهاتنی کردن.

کاتێک هەر سێ هاوڕێ چوونە ژوورەوە، چاویان بەو هەموو خواردنە کەوت زۆر

خۆشحاڵ بوون.

کەروێشک گوتی: هاوڕێیانی ئازیز لە مێژەوە چاوەڕێتان بووم بەڵکو لە دەرگام بدەن ئەوەتا خواردنیشم بۆتان ئامادە کردووە.

کاتێک قالەڕەشکە و ڕێوی و سمۆرە چوونە ژوورەوە لە خۆشیا دەستیان کرد بە گۆرانی گوتن و سەماکردن، تا توانییان خواردیان. دوای ئەوەی کە تێریان خوارد خۆیان گەرم کردەوە، سوپاسی ئەم هاوڕێ دڵۆڤانەیان کرد کە لە هەموو تەنگانەیەک بیر لە هاوڕێکانی دەکاتەوە.

ئینجا هەموو پێکەوە چوونە پێش پەنجەرەی ژوورەوە تەماشای بارینی جوانی بەفریان کرد کە هەموو جەنگەڵەکەی سپی کردبوو.







PDF 4 KURD

# زێڕە و لە دایک بوونی

ڕۆژێکی خۆشی بەهاری بوو... تیشکی هەتاو دەستی بەسەر دار و بەرد و گوڵی جوان و ڕەنگیندا دەگرت، هەتا گەرم بن و لە خەونی گرانی زستان هەڵستنەوە. لە ژێر دارێکی سپیندار قارچکێکی جوان و خەپە دەرچوو بوو، لە ژێر سێبەری ئەم قارچکەش گەڵایەکی تەڕوتازە کەوتبوو، کە بە ئاستەم دەجووڵایەوە.

لە ناکاو گەڵاکە جووڵەیەکی توندی کرد و منداڵێکی بچووک و خنجیلانە و ڕوومەت خڕ لە ژێر ئەو گەڵایە دەرچوو. چاوە گەشەکانی کردەوە و پێکەنینێکی جوان کەوتە سەر لێوەکانی... بە پێکەنینی ئەو هەتاویش شاد بوو. قارچک تەماشای دارە سپیندارەکەی کرد و گوتی: «ناوی چی دانێین؟»

دارەکە ڕووی لە هەتاو کرد و گوتی: «هەتاو گیان تۆ دەڵێی چی؟»

هەتاو بیری کردەوە و گوتی: «ناوی (زێڕە)ی بۆ دادەنێین.»

لەبەرئەوەی کە وەکو (زێڕە) جوان و درەوشاوەیە.

دار سپیندارەکە و قارچک ئەو ناوەیان زۆر پێخۆش بوو، لەو ڕۆژەوە ژیانی زێڕە دەستی پێ کرد، بەیانیان لە شەونمی گوڵەکان ئاوی دەخواردەوە و خواردنی ڕۆژانەش میوەی دارەکان بوو.







PDF 4 KURD



# زێڕە و ڕۆژێکی باراناوی

منداڵە جوانەکان، لە چیرۆکی ڕابردوو باسی (زێڕە)مان کرد...

بەڵێ... دوایی ماوەیەک (زێڕە) تۆزێک گەورە بوو، دەیتوانی بۆ خۆی لە ناو دار و دەوەن بگەڕێت و یاری بکات.

زۆر حەزی لە جووڵە و نارەحەتی دەکرد.

بە دوای پەپوولە باڵ نەخشینەکان و مێش هەنگوینەکان ڕای دەکرد.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی بەهار هەور و تەم ئاسمانی داگرت، نم نمی باران بەسەر گوڵ و دار و بەردا دەباری ... (زێڕە) لە دەنگی هەورە گرمە و بروسک دەترسا و نەیدەزانی بۆ کوێ بڕوات.

هەورە تریشقە زۆر دەبوو و ئاسمان فرمێسکی خۆی بەسەر زەوییدا دەڕژاند.

(زێڕە)یش لەبەر یاری کردن و جووڵەجووڵ لە هاوڕێکانی کە دارسپیندار و قارچک بوون، دوور بوو، نەیدەزانی بۆ کوێ پەنا ببات.

حەزی دەکرد وەک چۆلەکە و کۆترەکان باڵی هەبێت و بفڕێت، بەڵام نەیدەتوانی. لە ڕێگا هەر بیری دەکرد و لە سەرمانە لەرزی گرتبوو. کەم کەم ... ئاسمان لە گریان ڕاوەستا و هەورەکان لاچوون و باران چی تر نەباری......

(زێڕە) زۆر ماندوو بوو لەسەر بەردێک دانیشت، تا بحەسێتەوە. هێندەی پێ نەچوو کە بەردە ڕەقەکە بڵند بوو و زێڕەی لەگەڵ خۆیدا بەرز کردەوە.

وای... (زێڕە) زۆر ترسا...

ئێوە دەڵێن ئەوە چی بوو ...؟!





PDF 4 KURD

## زێڕە و کیسەڵ

لە چیرۆکی ڕابردوو باسمان کرد، کە زێڕە لە سەر بەردێک دانیشت تا بحەسێتەوە ، بەڵام بەردەکە زێڕەی بڵند کرد، لە بن بەردەکە سەرێک و چوار پێ دەرچوون و بە ئاستەم دەڕۆیشت.

دوای ئەمە دەنگێک هات و گوتی: ئەوە بۆ لە من دەترسی؟ زێڕە بە دەنگێکی لاواز وەڵامی دایەوە ئەوە تۆ چیت دەرکەوتی: من ناوم (کیسەڵ)ە.

ئەدی ناوی تۆ چییە؟ زێڕە کەمێک ترسی لە دڵ دەرچوو و وەڵامی دایەوە گوتی: ناوم (زێڕە)یە.

بەڵێ، ... زێڕە و کیسەڵ لەگەڵ یەکتری بوونە هاوڕێ، ئیتر باران ڕاوەستا بوو، بەڵام هەورێکی بچووک لە ئاسمان دیار بوو. هەتاویش خۆی گەیاندبووە سەرەوە خەریکی وشک کردنەوەی زەوی بوو.

زێڕە داوای لە کیسەڵ کرد، کە بیباتە لای هەڤاڵەکانی ... (دار سپیندار و قارچک).

کیسەڵ گوتی: من تۆ دەبەم ، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر هێمن و لەسەرخۆ دەڕۆم زۆرمان پێ دەچێ تا دەگەینە ناو دارستان. زێڕە حەزی دەکرد زوو بگاتە ماڵ و لای هاوڕێکانی، بەڵام ڕێگای پێ نەدەزانی و دەبوایە لەسەر پشتی کیسەڵ دانیشێت و خۆی بێ دەنگ بکات .





بەڵێ منداڵە خنجیلانەکان ، با ئێمە چاوەڕێ بین تاکو بزانین زێڕە چۆن دەگاتە لای هاوڕێکانی ...؟

زێڕە دوای ئەوەی کە جێگای خۆی لەسەر پشتی کیسەڵ خۆش کرد، بە کیسەڵی گوت: هاوڕێی خۆشەویستم دەست بە ڕۆیشتن بکە، چونکە زۆر بۆ هاوڕێکانم دڵتەنگم.

کیسەڵ ڕۆیشت و... ڕۆیشت... تاکو خۆی گەیاندە ڕووبار و بە زێڕەی گوت: زێڕە ئاگات لە خۆت بیت ئەوە دەچینە ناو ڕووبارەکە، نەک بکەویتە ناو ئاو! زێڕە لە ترسا چاوی داخست و تا کیسەڵ خۆی لە ئاو دا و لە ڕووبارەکە پەڕییەوە. کاتێک چاوی کردەوە لە دوورەوە باڵای جوانی سپینداری ناسییەوە ، زۆر دڵخۆش بوو، بەوەی کە گەیشتە جێگای لەدایک بوونی خۆی. بە پەلە لەسەر پشتی کیسەڵ دابەزی و لە خۆشیان دەستی بە هاوار و پێکەنین کرد و بە کیسەڵی گوت: هاوڕێی ئازیزم زۆر

سوپاسی تۆ دەکەم کە یارمەتییت دام تا بگەمەوە جێگای خۆم. ئەگەر خوا حەز بکات ڕۆژێک منیش پاداشی تۆ بە باشی دەدەمەوە و لە بیرت ناکەم.

بەڵێ گوڵە جوانەکان، زێڕە گەیشتە لای هاوڕێکانی (قارچک و دارسپیندار).

ئەوانیش بە دیتنی زێڕە دەستیان بە سەما و خۆشی کرد و ئەو ڕۆژە بە بۆنەی هاتنی زێڕە ئاهەنگێکیان ساز دا و هەموو باڵندە و گیاندارە بچکۆڵە جوانەکان لەو جەژنەدا بەشدار بوون .

زێڕەیش بەڵێنی دا کە بێ پرسی گەورەتر لە خۆی بەتەنیا سەفەر نەکات و لە ماڵەوە دەرنەچێت.



PDF 4 KURD